بۆ نەفسی کری کارەکە دائەمەزری وە پێویستە جارێکی تر عەقدی ئیجارەکە تازە بکەنەوە بەڵام ئەگەر کابراکە حەج و عومرەکەی بۆ ئەکا مردبوو ئەوە ئەم حەج و عومرەیە بۆ ئەو دروستە هەرچەن موخالەفەی تێدایە چونکی فائدەیەکی هەیە لە سەر ئازادبوونی ذمّەی مردووەکە لە واجبی عومرە :

وە ئەگەر ئیجارەی ذمە بوو هەم حەج و عومرەکە بۆ کری کارەکە ئەبێ وە پێویستە جارێکی تر حەج و عومرە بکا بۆ ئەصلەکە وە ئەو ئیجارەکە بەتاڵ نابێتەوە چونکی ئیجارەی فی الذمە بوو :

وە ئەگەر کابرای کری کار بە شێوەی تمتع حەج و عومرەکەی بۆ کرد ئەوە لە ئیجارەی عەینی دا عومرەکەی بەتاڵە وە پێویستە جارێکی تر عومرەی بۆ بکا وە لە ئیجارەی ذمەدا ئەم حەج و عومرە بۆ نەفسی کری کارە ئەبێ وە پێویستە جارێکی تر حەج و عومرە بکری بۆ ئەصلەکە بە شێوەی ئفراد وەکو دامەزرادە :

وە ئەگەر کری کاری گرت بۆ قران وە کابرا ئیفرادی کرد ئەوە ئەگەر ئیجارەی عەین بوو عقدەکە لە عومرەکەدا بەتاڵ ئەبێتەوە چونکی تأخیری عەمەل لە کاتی معیندا دروست نییە وە ئەو جۆرەی بەشی عومرەکەیش نادرێ پێی وە ئەگەر ئیجارەی ذمە بوو ئەوە ئیجارەکە وەکو خۆی ئەمێنێتەوە بەڵی ئەگەر بۆ ئحرامی عومرەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ میقاتی سابق ئەوە فیدیەی ئەکەوێتە سەر وە بە قەدەی ئەو مسافەی بەینی مکە و میقاتە لە ئوجرەکەی دائەشکێ

ز و ئەگەر بە شێوەی تمتع حەج و عومرەکەی کرد بێ وە لە ئیجارەی عەینیدا وەکو لە حاشیەی

جەمەلدا ئەڵێ راجح وایە عقدەکە ئەمێنێتەوە وە لە ئیجارەی زیممەدا بێ گومان

عەقدەکە باقیە بەڵام ئەگەر کابرا لە کاتی ئیحرام بە حەجدا ئەگەڕێتەوە بۆ میقات

فیدیەی لە کۆڵ دەبێتەوە وە بە قەدری نوقصانی عەمەل لە ئوجرەکەیشی کەم ئەبێتەوە ...

بیدار بن ئەگەرچی لەم بەیانا باس کراوە بەڵام بۆ مضبوطی آگادار بن

لە هەر ماوەیەکدا بە مخالفە کابرای کرێکار تجاوزی کرد لە میقات

پێویستە بگەڕێتەوە بۆ میقات ئەنا فیدیەکەی لەسەر خۆی واجبە

بیدا وە بە ئەندازەی زەحمەتی ئیحرام بەستن لە میقاتەوە لە کرێکەی

ناقص ئەبێ :

وە ئەگەر بە خەوی جاعی وە حەجەکەی بەتاڵ بووەوە ئەوە ئەگەر ئیجارەی

عەینی بوو ئەو عەقدە فەسخ ئەبێتەوە وە پێویستە جارێکی تر بە کرێ بگرن

وە ئەگەر ئیجارەی زیممە بوو ئەوە ئەو حەج و عومرە لەسەر خۆی حسێب ئەکرێ

وە لەبەر ئیفسادەکەیشی پێویستە ساڵی داهاتوو بێتەوە قەزای بکاتەوە بۆ خۆی

جا لە ساڵی سێهەمدا لە باتی کابرای مستأجریش ئەو حەج و عومرە بکاتەوە

وە فیدیەی ئیفسادی حەج و عومرەکەیش لەسەر خۆیەتی ...

وە پێویستە بزانن پێویستە بوو لەمەزرانی عەقدی ئیجارە کابرای بەکرێ گیراو
لەگەڵ ئەوکەسا کە لەو بەکرێ ئەگری چ وەصی مردوو چ کابرای زیندووی پێ کەوتبوو زانا بن بە ئەرکان وە واجبات وە سونەتەکانی حەج وعومرە زانستی لەوانەیش گرانە کەوابێ زۆربەی عەقدی ئیجارە کە بەتاڵ ئەبێ هەرچەن رەحمەتی خودا زۆرە وە مادام کابرا حەج ئەکا بە نیەتی کەسێکی وە هاکە حەج وعومرە واجبێ لەسەری ئومێد وایە دروست بێ وە خودا قەبوڵ بکات :

وە چارێ کە ئاسان بێ لەم کارا دووشتە یەکەم ئەوکەسەی کە ئەوکەسە رەوانە ئەکا بۆ حەج بە شێوەی (جعالة) رەوانە بکا مەعنای جعالە ئەمەیە کەسێ مالێکی دیاری بگرێتە ذمەی خۆی بۆ کەسێ لە مقابلی کارێکی معلوم یا مجهول وەکو ئەوە بڵێ هەرکەسێ کتێبە وونبووەکەم بۆ بهێنێتەوە دە دینارم لە سەرە تەسلیمی بکەم وە کابرائێ بە هەرچەند حەولی کتێبەکەی بۆ بهێنێتەوە واجبە خاوەن کتێب دە دینارەکەی پێ بدا وەکو قونتەرات یەکێ خانوی ئەدا بە قونتەرات هەر وەستایێ بۆی تەواو بکا هەزار دیناری پێ ئەدا کابرایش لەم شوێنانە ئەڵێ هەرکەسێ حەج وعومرە ئێکی شەرعیم بۆ بکا کە سەرم دووصەد دیناری پێ بدەم جا ئەو کەسە کە طالبە ئەروا حەج وعومرەکەی ئەکا

وەکاتی هاتنەوە خاوەن کار پارەکەی پێ ئەدا .

دووهەم چوار شێوەی (حەج بە نەفەقە) مەثلا کابرا لە خۆی ئامادە بکا

لە بەر ڕەزای خودا حەج و عومرەی بکا بۆ فلان کەسی مردوو کە حەجی لەسەر

واجب بووە وە نەیکردووە : خاوەن کاری لەو مردووەیش بە نادی

مەسرەفی لەو سەفەرەوە هەرچەند ئارەزووی بێ بیدا بە کابرا لە مقابلی

ئیحسانەکەیەوە :

ئیتر لەم دوو شێوەدا طرفێن لەکاتی گرێ کەوتن لەسەر شتێکەوە گەورە کە بزانن آدابی

حەج چۆنە یا نەزانن دروستە وە ئەگەر کەسێک لەو ڕادا بۆ حەج کە ئەگەر خۆی

زانای ئەوە باشە ئەگەر نا ئەپرسی لە عالمێ وە آدابی نیشان ئەدا و ئەوێش

بە جێیان دێنێ :

هەروا بە شێوە ئامۆژگاری پێیان ئەڵێم ئەوکەسانە کە حەجیان لەسەر

واجبە وە آدابی نازانن (واجبە) فێری آداب ببن وە یا خود هەر بە دەکەسێ

عالمی آمادە بکەن بدەنەوە کە لە ڕێگەدا آدابی احرام و طواف و سەعی بەینی

صفا و مەروە و چوون بۆ عەرەفات وە گەڕانەوە لە عەرەفات وە

باقی داجیاتەکانیان نیشان بدا هەرکەس دارای وەخۆی آداب نەزانێ

وە پرسی عالمی زانا نەکا ئەوە حەج و عومرەکەی بەتاڵە وە تاوانباری قیامەتە

## ( آدابی طوافی کعبة الله )

کە تحیاتت بەست بێ گەردولەکە ‌ ‌ ‌ ‌ بە ئیخلاصی دڵ تۆ بکە لەمەکە
کاتێ گەیشتی بە خاکی حەرەم ‌ ‌ ‌ ‌ غوسل سوننەتە لەبەرای اکرم
کە چوویتە ناو بەیت بەرای خوداناس ‌ ‌ ‌ ‌ طوافی قدوم بکە بە اخلاص
ئەمە سوننەتە ئەم جار حوت مەگرە ‌ ‌ ‌ ‌ آدابی طواف لەمن وەربگرە
بۆ طواف هەیە گەلێ واجبات ‌ ‌ ‌ ‌ گەلێ سوننەتیش معلومن لەلات
یەکەمین واجب ستری عەورەت بۆ ‌ ‌ ‌ ‌ بۆ ژن سەرتاپا غەیری دەست و رو
بۆ پیاو مابەینی ناوک و ئەژنۆ ‌ ‌ ‌ ‌ خۆنیشی وەک ژنە معلومە لەتۆ
دووەم پاکییە لە پیسی بۆ لەش ‌ ‌ ‌ ‌ بۆ بەرگ و پۆشاک بزانە بێ غەش
لە بێ دەس نوێژی هەم لەلەش پیسی ‌ ‌ ‌ ‌ ناشێ بۆ دەوری کەعبەی تقدیسی
ژنی بێ نوێژە یا خود زەیسانە ‌ ‌ ‌ ‌ چاری هەر صبرە قەزای بیززانە
کاتێ ڕێگا ڕبون برۆن بۆ طوف ‌ ‌ ‌ ‌ چاری تر هەیە بە شێوەی انصاف
لەسەر قەولێکی ئیمامی احمد ‌ ‌ ‌ ‌ ابن حنبلی اعلم و ارشد
هەرچەن طهارەت واجبە لای عام ‌ ‌ ‌ ‌ بڕیار دراوە بە پاسای ئیسلام
بەلام لە باتی ئەو طهارەتە ‌ ‌ ‌ ‌ فیدیە کافیە چون کفارەتە
با طواف بکەن بە حاڵی خۆیان ‌ ‌ ‌ ‌ بەلام حەیوانی سەربڕن بۆیان

مطافیش پاک بی سا مه‌گه‌ر له‌وه‌ی    بلو تو زه‌حمه‌ت بێ خوی لی لابده‌ی

ده‌س نویژت شکا له‌ناو طوافا    خوت مه‌ده‌ به‌سه‌ر جفای خلافا

به‌ په‌له‌ برو ده‌س نویژی بگره    له‌وو کردوته‌ ژیری پی بگره

ئه‌ر به‌ینی زور بی ئه‌لبی بییته‌وه    له‌ ئه‌وه‌ل جارد پیاپیا بیته‌وه

واجبی سی هه‌م ئه‌مه‌یه‌ (کابه‌)    لای چه‌پته‌وه بی به‌دل آگا به‌

چواره‌م یه‌که‌مین طوافی اسعد    دامه‌زری له‌سه‌ر (حجرالاسود)

له‌لای چه‌پیه‌وه پێی راوه‌سته‌    ده‌س به‌طواف که‌ ئه‌م شیوه‌ به‌سته‌

به‌ره‌و ژوی برۆ هه‌تا لا له‌وه‌ی    جا به‌لای راستا طوافت ئه‌که‌ی

پینجه‌مین واجب طواف هه‌ر جاری    به‌لکو داخوری هه‌ر ده‌رگای باری

شه‌شه‌مین شیوه‌ی طوافت وا بی    به‌ ده‌وری ئه‌جزای گشت کابه‌ دابی

نه‌کێ بروی به‌سه‌ر له‌ وشاذه‌روانا    زیاده‌ دیواره‌ له‌ کابه‌ی جوانا

یا له‌ سوره‌ته‌دا ده‌ستت دریژ که‌ی    له‌سه‌ر شاذه‌روان ده‌ستی خوت گیر ده‌ی

یا له‌ طوافا حجری اسماعیل    پیاپیا رابوری ده‌خیل صد ده‌خیل

چونکی ئه‌و (حجره‌) له‌ کابه‌ی برزه‌    گه‌ران له‌ده‌وری له‌سه‌ر تو فه‌رزه‌

یانی طوافی فه‌رزه‌ له‌سه‌ر تو    (کابه‌) دابگری هه‌موی کونه‌ و نو

حەوتە یەن قەسدی طوافە بە دل — طوافی مطلق کافیە و کامل

بو هەر طوافی لە مناسک بێ — یەکەم مەبەستی شخصی ناسک بێ

وەکو طوافی افاضەی محتوم — یا لە بو قدوم سونەتی معلوم

بەلام طوافی لە مە خارج بێ — قەصدی مقیّد فەرزە بیتە جێ

وەکو طوافی نەذری یا وداع — بلی نویتُ طوافَ الوَداع

او طواف النذر چونکی لەمانە — لە مناسک نیین باشی بزانە

پیویستە قصدی تایبەتی لەوان — بێ قیدی تعیین دەس نادەن بومان

هەر شتەم قصدی خوت لانەدەی لێ — غەیری طوافی مقصودە بوتو

لە هەر حەوجاری طوافەکانا — قەسدت طواف بێ لەو جێگە جوانا

سونەتی طواف وایە بێ خلاف — بە پێی ستور بخوێ لە عەززی مطاف

لە طوافەدا بە یاسای اسعد — دەس بینێرە سەر حجر الاسود

تەویلی خوێشت رانێ لە سەری — ماچیشی بکە لە بەر دل بەری

ئەگەر ری نەکەوت دەس یا اشارە — بەسە فەرمودەی شاهی مختارە

حەرامە هیرش نە خسوس بە عدد — بو زیارەتی حجر الاسود

عبادەت لە سەر سونەتی ڕێنە — نەک بە عادەتی دور لە تمکینە

هەرواسونەتە ئەبێ بیزانی     دەس پیا هێنانی ڕوکنی یەمانی

لە بەران بەری دەرگای کابەدا     ذکری مەشهورە خێرت پێ ئەدا

لە دوعا کانا هەرچی مأثورن     بیان خوێنەوە وەسیلەی نورن

سونەتە بو پیاو نزیکی کابە     بەلام بو ژنان دوری صوابە

پیاوان لە روژا بو ژنان لە شەو     سونەتە طواف بو نور و بیرتەو

مطاف مابەینی مقامی خلیل     تا دەرگای کعبەی حەزرەتی جلیل

با ژنکیش ئەلێن دور لە خلافە     تا رەواقەکان هەمو مطافە

لە دو طوافەدا سەعی لە دوایە     سی دەورەی ئەوەل رەملی تێدایە

سونەتە بو پیاو نەک لە بو ژنان     ژنان آرامی پێویستە بویان

مەبەستمان لە (رمل) بو کاکی خوشناو     پەلە لە رەوتا و نزیکی هەنگاو

لە وسی طوافا تەرمیلیان تیایە     شێوەی (اضطباع) بەرزە بەیانە

هەروا لە سەعیا بە واتەی صحیح     اضطباع بو پیاو سونەتە و ملیح

ناوقەدی فوتە لە ژێر بالی راس     سەریان لەسەر چەپ لە لوعا موخاص

لە لای شافعی خێرە بێ خلاف     خوێندنی قورئان لە کاتی طواف

مانعیش نیە لە وردی مەشهور     تا ببەتی ئەوەی ثابتە و مأثور

سوننەتە طوافێ یەک لە دوی یەک بێ    لای قەولێ فەرزە جابالی شک بێ

پاش طوافەکان لە پشتی مقام    لە بو ابراهیم علیه السلام

دو رکات لە نوێژ سوننەتی دینە    مخصوصی آیەی ذکری مبینە

لە یەکەم رکات سورەی کافرون    بو دوهەم اخلاص معروفە و مسنون

لە روژا بە سر لە شەودا جهری    بخوینەرەوە بو زوری أجری

لای بارێ ئیمام ئەم نوێژە فەرزە    چون لە مری خودای سەماو سەعەرزە

سوننەتە خشوع بو کاتێ طواف    ئەوە بێ پیویستە بو دەرونێ صاف

مکروهە وتار الا لە بو خێر    نظری حەرامم حەرامە بو غەیر

طواف بە وینەی نوێژە بو ئینسان    لە گەلیشتا یەکسانن یەکسان

لە حج را چەن جێ بو دوعاو نزا    بو بارەی خێرو بو چارەی سزا

لە طوافدا و لای ملتزم دا    لە ژێر میزاباو لە لای زەمزەم دا

پشتی مقامی حضرەتی خلیل    دەم بە دوعا بە لە ئێبرای جلیل

لە سەر صفا داو لە سەر مەروەی بەرز    لە عەرەفاتا حاضر بە بو عەرز

هەم موزدەلیفە جێگەی دوعا یە    رمیا، مەلبەندی لالە و نزا یە

لە کاتێ رەجمی هەرسێ جەمەرات    دوعا ئەبیتە وەسیلەی نەجات

هەرچون جێ دوعا ناکرێ حصری    لە مانەی فەرمو حسنی بصری

## یاسای چونە ناو مەکە و خانوی خودا

کاتی ئیحرامت بەست لەگەڵ دە واجی ذکر و دوعای خێر و لبیک کردن بە رێدا
رو بکەرە شاری مەکەی مکرمە زادها اللە شرفا کاتی نزیک بویتە وە لە عەرزی
حەرەم غوسل بکە وە بە دەس نوێژە وە بە رورە حەرەم وە داخلی شاری
مکە ببە کاتی کە کەعبەی پیروز دەرکەوت دوعای تایبەتی هەیە بیخوێنە وە
بە ئەرە بە وە داخلی مزگەوتی مەکە ببە وە فورا دەس بکە بە طوافی قدوم ، واتە
طوافی واردبون بە کعبە ئەم طوافە سوننەتە وە بزانن طواف چە واجب
چە سوننەت چەن واجبات وە چەن سوننەت وە چەن مکروهاتی
هەیە .. واجباتی طواف هەشت شتە یەکەم پاکی لەش
وە پوشاک وە جیگەی طواف لە هەر پیسیەک کە عەفوی لێ نە دراوە
وە پاکی یە لە بێ دەس نوێژی وە لەش پیسی هەرچەن بە هوی حێز و رە نفاسی
ژنە وە بێ : ئەگەر ژنی لەو کاتا کە وتە عوزری شەرعی یە وە یا خود
منداڵی بو وە کەوتە زەیسانی یە وە ئەوە ئەبێ صبر بکا وە لە مەکە دا
بمینێتە وە هەتا ئەو عوزرە تەواو ئەبێ وە یا لە خوێنی زەیسانی رزگار ئەبێ
پاشی ئە وە غوسل بکەن وە بچن طوافەکەیان بکەن : وە ئەگەر بویان
نە دەکرا لە مەکە را دەوام بکەن لە ترسی بە جێ مان لە قافلەکەیان ئە وە حەیوانی
سەر ببرن بە نیەتی رزگاری لە ئیحرام وە بروننە وە بو ولاتی خویان هەتا ساڵیکی تر

خودایان لێ ڕازی بێ

بۆیان ڕێ نەکەوێ بێنەوە بۆ حەج . بەڵێ ئەمە وەزعا ئیمامی احمد بن حنبل
کە یەکێکە لە چوار ئیمامە گەورەکان فەرموودەیێکی هەیە کە طهارەت شەرطی دروستی
طواف نییە وە دروستە لەسەر ئەم فەرموودە ئەو ژنانە خوێنیان قائم بکەن
کە مەطاف پیس نەبێ وە حەڕەت جار طواف بکەن بە دەوری کابەی پیرۆزدا
بەڵام واجب ئەبێ لەسەریان حەیوانێکی وا بۆ قوربانی بشێ سەری ببڕن
بۆ فیدیەی ئەم بێ طهارەتی یە وە ئەمە ئەبێ بە کفارەت بۆیان . وە عالمی
بەرز ابن قدامە ئەم فەرموودەیە لە کیتێبی (المغني) دا نووسیوە بەم عبارەتە
وعن احمد ان الطهارة ليست شرطا فمتى طاف للزيارة غير متطهر اعاد ما كان بمكة
فان خرج الى بلده جبره بدم انتهى . دەی با بچینە سەر ئەم فەرموودەی ئیمام احمد
بەم جۆرە حەجەکەیان تەواو بکەن ؛ تا ئەگەر خوا تەوفیق وا جارێکیتر بێنەوە
بۆ حەج وە ئەگەر هاتیلیان نەبو ئەوە واجبەکەیان بەجێ هێناوە :

ای اعاد الطواف بعد الطهر ما دام في مكة فان [illegible] الخ

ئەم باسە فەرموودەیێکی ئیمامی شافعی هەیە خودایان لێ ڕازی بێ کە پاش ئەوە ژن ماوەی
شەو و ڕۆژی حەیزی ڕابورد وەزعی وای بەسەرهات کە خوێنەکەی بە تەواوی نەما
وە تا چارەکە سەعاتی یا زیاتر ئەم پاکی یە دەوامی کرد ئەوە ئەو ماوەی پاکی یە
بە ماوەی حەیز دانانێ دروستە لە ژنانە لەسەر ئەم فەرموودەیە ئەگەر ئەو کاتی پاکی یە
دەست کەوت بۆیان گورج غوسل بکەن وە بڕۆن طوافی کابەی پیرۆز بکەن ئەمە دروستە.

بۆ عەمەلی نەفسی خۆیان تەقلیدیان بکەن هەتا حەججەکەیان بۆ بکری وە بەخۆشی بڕۆنەوە

ئەگەر یەکێ لە کاتی طوافا پێ دەسنوێژی بەسەرا هات ئەوە زوو بڕوا دەس
نوێژ بگری و بگەڕێتەوە وە لە سەرێ ژمارەی طوافانەکردویەتی حەوت جارەکە
تەواو بکا . وە ئەگەر ماوەی دەسنوێژەکەی زۆر بوو ئەلبەت هەر لە سەرێ
طوافەوە دەستی پێ بکاتەوە :

واجبی دووهەم داپۆشینی عەورەتە کە بۆ پیاو لە بەینی ناوک و ئەژنۆیەتی وە
وە بۆ ژن هەموو لەشیەتی اِلا دەست و دەموچاوی وە حوکمی نوێژی وەکو حوکمی ژنە
واجبی سێهەم ئەوەیە طوافەکە لە یەکەم نوختەی حجر الاسودەوە دەستی پێ بکری
ئەگینا ئەو طوافە حسێب ناکری کەوابێ ئینسان بە قەی پێیەک لە لای چەپی ئەو
حجر الاسودەوە بوەستی وە ترو بکاتە بەرەو کە هەتا لالەی راستی جا دەس بکا
بە کاری خۆی   چوارەم واجب ئەوەیە کە شانی کابەی پیرۆز بکەوێتە لای
دەستی چەپەوە   پێنجەم ئەوەیە کە ژمارەی طوافەکان حەوت جار بێ وە
ئەگەر کەوتە شکەوە لەوا شەش جارە یا حەوتە ئەوە بە شەش جاری دابنێ
وە طوافێکی تر بکا با لە دگومانە دەربچێ .

شەشەم ئەوەیە کە ئەو حەوت جار طوافە بە دەوری هەموو لەچوای (کابە) دا بێ
یاخود بە دەوری ئەو زیادە دیوارا کە لە دیواری کەعبە دەرنراوەتەوە وە بە دەری

لەو شوێنەیشا کە مەشهورە بە حجری اسماعیل ، چونکی ئەمانە لە عەینی خانوی

کعبة اللەی پیرۆزن : هەروا ئەگەر لە نزیکی کعبەدا طوافی کرد

وە بە فەرز و تقدیر دەستی چەپی راکیشا بو سەر ئەو زیادە دیوارە وە

بەو شێوە هەڵسووڕا بە دەوری کەعبەدا ئەوە طوافەکەی دروست نیە

چونکی لەم کاتەیشا دەستی چەپی والە ناو ئەجزای کەعبەدا وە بە دەوری

کەعبەدا هەڵنەسوڕاوە

حەوتەم ئەمەیە لە ئەوەلی طوافەکەوە قەسدی طوافی بەیتی بێ بەلام ئەو

طوافە ئەگەر خارجی مناسکی حەج بێ وەکو طوافی وداع (1) یا طوافێ کە نذری

کردبێ لە سەرەوی ئەوە پێویستە لە نیەتەکەیا دیاری بکا بڵێ نیەتم هەیە طوافی نذر

یا طوافی مال ئاوایی ئەکەم فەقەط بو طوافی قدوم و طوافی روکنی حەج یا عومرە هەر

نیەتی طوافی بەیت بەبێ دیاری کردنا کە طوافی روکنی حەجە یا عومرەیە یا قدومە

کافیە وە قەناعەتی پێ ئەکرێ :

هەشتەم لە واجبات ئەوەیە لەو ماوەی طوافا قەسد و نیەتی کری لە عیبادەتە

لانەدا بو شتێکی تر وەکو قەسدی تماشاکردنی مەطاف یا ئەوەی کە هەڵسووڕێ

بە دەوری بەیتیا یا بو مەنظەرەی ئەو بنایانە وە ئەو مەنارانە کە لە دیا هەن

(1) دلیلی دەرچونی ئەم طوافە ئەوەیە کە لە پاشی هەردو تحللە وە پاش تحلل مناسک نابینی مە

## سوننەتەکانی طواف

سوننەتەکانی طواف زۆرن یەکەم ئەمەیە بەپێی خۆی بە دەوری کەعبەدا بسوڕێتەوە هەرچەن کە طواف بەسواری دروستە دووهەم سوننەتە ئەگەر بەبێ ئازاردانی خەڵک بۆی بکرێ لەهەمو طوافەکانا دەست بدا لە (حجرالاسود) وە تەویلی لەسەر دانێ وە ماچی بکا ئەگەر زۆر ئەکوت بوی بەس دەستی لێ بدا وە ئەگەر زۆر ئەکوت ئیشارەتی بۆ بکا ئەمە بۆ پیاوە بەلام بۆ ژن ئەم وەزعانە سوننەت نیە الا لەکاتی شەوا بەمەرجی مەطاف خالی بێ لە قەرەبالغ :

سێهەم سوننەتە بۆ پیاو لەنزیکی دیواری کابەوە طواف بکا ئەگەر بۆی رێ کەوێ بەلام بۆ ژن سوننەتە لە دوورەوە بێ مەگەر لەکاتی مەطاف خالی بێ :

چوارەم سوننەتە بۆ پیاو دەست بێنێ بە روکنی یەمانی دا بەلام ماچی نەکا بەس لە پاش ئەوە دەستی لێدا دەستی خۆی ماچ بکا وە باقی روکنەکان ئەماچ کرێنیان وە ئەوە دەسلێدانیانا سوننەت نیە

پێنجەم لە و طوافەدا کە سەعی مابەینی صفا و مەروەی بەدوادا بێت خوای طوافی قدوم بێ لە حەجا یا طوافی روکن بێ لە سێ دەورەی ئەول دا (رمل) سوننەتە بۆ پیاوان ئەویش بریتیە لە پەلەپەلە کردن لە رۆیشتنا وە نزیک بونی بەینی هەنگاوەکان ...

شەشەم لە وسێ دەورەدا کە رەملیان تیدایە سونەتە بو پیاو ڕاضطباع،
کە بریتیە لەوە هەردو سەری فوتەی سەرو بخاتە سەرشانی چەپی وە ناوە
ڕاستەکەی بخاتە ژێر قولی ڕاستی :

حەوتەم: سونەتە کە طوافەکان ما بەینیان نەبێ واتە هەر طوافێکی
تەواوکرد بەشوینی ئەوا دەست بکا بە طوافێ هەتا هەرحەوتیان تەواو
ئەبێ : کەوابێ مکروهە بڕینی طواف بو بەجێ هێنانی نوێژی جنازە :

هەشتەم: پاش تەواو بونی طوافەکان سونەتە دوو رکات نوێژی سونەتی طواف
بکا لە پشتی مەقامی ابراهیمەوە ع نبینا وعلیه السلام لە رکاتی یەکەم دا قل یا ایها الکافرون
وە لە رکاتی دوهەما قل هو الله احد بخوێنێ ئەگەر لە بەر قەرەبالغی لەویا نوێژەکەی نەکرد
بڕوا بو حجری اسماعیل ئەگەر لەویا نەکرا بڕوا بوە کە لە مزگەوتەکانە لە حەرەم دا
ئەگەر تری نەکەوت لە خارجی حەرەم دا بە هەرحال تەرکی نەکا هەتا ئەگەر خوی
بوی نەکرا کری کاری بگری ئەو نوێژەی بو بکا وەکو لە ایضاح دا فەرمویەتی
وە ئەگەر بە سونەتی عام دو طوافت کرد بە دەوری کعبەدا یان یەک طوافت کرد سونەتە
ئەو دو رکاتە نەدیرە لە پشتی مەقامی ابراهیمە و بکەی لە پاش هەموطوافێ لە طوافانەو
وە بو حەلکی خارجی حەرەمی مکە کاتی تری کەوتە بیت سونەتە هەرچەن بوی بکری
طوافی کعبەی شریفە بکا جارێ بێ دو جار بێ یا زیاتر بێ وە ئەمە باشترە لە نوێژکردن

## آدابی سەعی لە بەینی صفا و مەروەدا

لە پاش طوافی خانەکەی خودا   سەعیە لە بەینی صفا و مەروەدا

ئەم صفا و مەروە دوو جێن لە عوزرە   هاتوچۆی ناویان لە دینا فەرزە

واجباتی سەعی چوارن بێ خفا   یەکەم ابتدای سەعیە لە صفا

دووەم آخری بە مەروە بێنی   سێهەم حەوت جار بێ لە سەر یقینی

چوارەم بێتە جێ بە شێوەی مەرسوم   لە پاش طوافی روکنا یا قدوم

ئەوەی سەعی کرد پاش طوافی قدوم   اعادەی نا کا پاش روکنی معلوم

نابێ وقوفی عەرەفەی علیا   پاش طوافی روکن لە پێشی سەعیا

ئەمەش بۆ دەرکەوت زۆرکات تەرتیب   باشی لەم جێدا تذکارە و تقریب

### سوننەتەکانی سەعی

سوننەتە بە قەدی قامەتی بەشەر   صفا و مەروەدا سەرکەویتە سەر

لە سەر صفا وە سێ دفعە تکبیر   سوننەتە لە سەر کردەوەی بشیر

جا حمد و ثنا و خاتمەی تکبیر   لە پاسای سەعیە ئەی برای خبیر

شوێنی تایبەتی هەیە بۆ ساعی   لەویا توند ئەڕوا پیاوی مراعی

هەروا (اضطباع) لێرا سوننەتە   بەس لە بۆ پیاوان: بۆ ژن بدعەتە

سەعی حەوت جارە لەم سەرتا ئەوسەر   هەر سەری جارێ ببە باخەبەر

بەم هاتوچووە سەعی دێتە جێ   ویردی مأثورت فەرامۆش نەبێ

## ئادابی سەعی لە بەینی صەفا و مەروەدا

سوننەتە کە ئینسان طوافی بەیتی تەواو کرد و نوێژی کرد لە پشتی مەقامی ابراهیمەوە علی نبینا وعلیه السلام
بچێ استلامی حجر الأسود بکاتەوە و جا بڕوا بۆ سەعی لە بەینی صەفا و مەروەدا  وە واجباتی
سەعی چوارن  یەکەم ئەوەڵی سەعیەکە لە بەرزی صەفاوە بێ  دووهەم آخری ئەو
سەعیە لە بەرزی مەروەدا بێ  سێهەم ژمارەی ئەو هاتوچوە حەوت جار بێ
بەم اعتبارە رۆیشتن لە صەفاوە بۆ مەروە یەک جارە  وە هاتنەوە لە مەروەوە
بۆ صەفا بە دوو جار بژمێرێ  چوارەم ئەم سەعیە لە پاش طواف القدوم وە یا
لە پاش طوافی رکنەوە بێ  وە ئەو حاجیەی کە لە پاش طوافی قدوم سەعی کرد
لە بەینی صەفا و مەروەدا ئەوە لە پاش طوافی (رکنی) اعادەی ئەو سەعیە ناکاتەوە چونکی
لەم شێوەدا سەعیەکەی مکروهە لە بەر ئەوە سەعی لە عباداتی مستقلە نیە وە تابعی طوافە
وە سوننەتەکانی سەعی زۆرن  یەکەم سوننەتە سەعیەکەی لەگەڵ دەس نوێژا بێ
وە عەورەتی داپۆشرابێ  وە بە خلافی ئەمەوە مکروهە  دووهەم سەعیەکەی توند بێ
لە جێگەی توند رۆیشتن دا وە عادەتی بێ لە باقی شوێنەکانا  سێهەم سوننەتە کە ئەو
حەوت جارە هاتوچوە ما بەینیان کەم بێ وە یەک لە شوێن یەک بێ بە پەلە کردن
چوارەم ئەگەر بۆی تێ کەوت لە وەختی حەلوەتا بێ  پێنجەم ئەوەیە کە رعایەتی ئەو
ذکر و دوعایانە بکا کە واردن وە استغفار زۆر بکا وە بلێت رب اغفر وارحم وتجاوز عما تعلم
انک انت الأعز الاكرم اللهم آتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار

### باسی ئختیاری نەوعی لە نەوعەکان

کە ئاگادار بوی لەو ئادابانە — بە دڵ گوێ بگرە بۆ ئەم بەیانە

تۆ خۆت موختاری لەو سێ نەوعانە — ئیحرام هەرچۆنێ ئەبەستی جوانە

ئەگەر بە تەمتع ئیحرام ئەبەستی — لە مانگەکانی حەج ئەبێ بیبەستی

کە ئیحرامت بەست لە عەرزی میقات — ڕو بکە لە مەکە لە بۆ بەرەکات

نزیک بویتەوە لە عەرزی حەرەم — غوسلی لەش بکە و ببە خاترجەم

گەیشتی بە بەیت دەس کە بە طواف — ڕوکنی عومرەیە بێ شوبهە و خلاف

تو ڕاستت لەوی لە من گوێ بگرە — طوافی قدوم دەس بادا لێرە

ئادابی طواف زۆر عالیم کردی — بە جێیان بینە بە جوانمەردی

پاش طواف بڕۆ بۆ سەعی مابەین — صفا و مەروەی حق ای نوری عەینێن

پاش سەعی بە حلق یا خۆ بە تقصیر — تحلل بکە و خۆت بکە بە میر

تا ئیحرام بە حەج بە حق ئێتە پێش — مەشغولی دین بە بێ فکر و ئەندێش

لە نوێژی سونەت لە دەوری قوربان — لە طوافی بیت بۆ چاری تاوان

یاخود لەو بەینا چەن عومرە بکەی — یەقینی بە جەزای خێر خۆت ئەگەی

یا هەر لە بەینا بە دڵێکی ساف — بۆ ڕەزای خودا بکە اعتکاف

احرام بە حج

جا کاتی حەج هات مەردانە هەستە — وەکو مەکەیی ئیحرام ببەستە

بڕۆ بۆ مینا شەو بنوە لەوێ — لەنا بە قەولی فقیهیەت ئەکەوێ

سبەینێ بڕۆ بۆ ئەمرەی عظیم    نوێژەکان بکە بە جمع التقدیم

حا بڕۆ لە بۆ عەرصەی عەرەفات    بپارێرەوە لە هەوای کائنات

لە ڕۆژ ئاوا بۆ لە سەر عەرەفە    بێرە خوارەوە بۆ موزدەلفە

مەغرب و عشا بە جمع التأخیر    لەوێدا بکە لێ تەفرەو تقصیر

لە موزدەلفە حەوتا بەردی جوان    هەڵبگرە لە بۆ رمی جەمرەکان

لە پاش نیوە شەو پیرانی بێ سلام    داپەڕن لە بۆ (مشعر الحرام)

جوانەکان لە پاش نوێژی بەیانی    بڕۆن بە شێوەی شەرمی لسانی

پاش هەتا وکەوتن زۆر مرتبە    بڕۆن بۆ رمی جمرەی عقبە

پاش رمی جمرە زوو بکە لە منحر    جێ سەربڕینە لە مینای انور

فدیەی تمتع سەربڕە باشە    ئەم جار بە پاکی سەرت بتاشە

بە کەم تحلل بەدوو لە مانە    بۆتۆ حاصل بۆ بێزانی جوانە

بە غێری جماع هەرچیت لەتەوێ    لە حەرامەکان بوت حەلال ئەوێ

ئەوەیش بە طواف بۆتۆ حەلالە    هەر دو تحلل لەوێ کەمالە

دەی بڕۆ بۆ بەیت بۆ رکنی طواف    پاش طواف سعی صفا و مەروەی ڕاس [?]

جا پاش نیوەڕۆ بێیەوە منا    سێ شەو لەوێ بە بەشادی وەهەنا [?]

سێ ڕۆژەی تشریق هەر ڕۆژێ چوار    رەمی جمرات بکە بە قەرار

## شێوەی قران وایە کە ژێ

ئەگەر بە (قران) ئیحرامە کەت ببێت    حەج و عومرەی جوت کردت بە مە بەست

کە چویتە (مەکە) طوافُ القدوم    جێ بە جێ بکە بە یاسای مەعلوم

طوافُ القدوم لێرا مەعروفە    مادام طوافت پێش لە وقوفە

ئەوەی لە بۆ حەج پێویستە بکەی    بۆ حەج و عومرە لۆت رەوا ئەدەی

فیدیەت لەسەرە وێنەی تمتع    لەبەر ئاسانی کردەدەت فاسمع

ئەگەر ئیرادەت مەقصودە بە دل    افراد روناکەو دورە لە موشکل

پاشی ئیحرام بەستن بە رێکی صاف    رو لە مەکە بێ بە عەزمی طواف

افضل وەهایە بە شێوەی معروف    بروێتە مەکە پێش وەزعی وقوف

لە پێش مەکە دا چونە عەرەفات    بو گەلێ سونەت ئەبێ بە آفات

کە چوی بۆ (مەکە) لە (ذی طوی) دا    خوت لێشو تا داوان بدە بە آدا

کە بەیتت بینی بە صفای سینە    نوری رەحمەتی خودا ببینە

بپارێرەوە لە خودای منان    بو تشریفی بیت بو عەفوی تاوان

ئەم جار لە دەرگای بنی شیبەوە    بەبێ شەرمی ئەدەب بەرد بە بێتەوە

وزرا طوافی قدوم بینە جێ    تحیەی مسجد لە دیا وا ئەبێ

گەر بیمی فەوتی نوێژی فەرزت بو    یا نوێژی فەرزی جماعەت هەبو

لەو کاتە لە پێش طوافی قدوم    نوێژە کەت بکە بە شێوەی مەرسوم

جاپاشی ئەویشە کەرت طوافی قدوم          سونەتە بیکە بەشێوەی مەرسوم

بەلامی طوافی قدوم بۆژنان          هەل بگرن بۆشەو چاترە بۆیان

جا ئەگەر وێستت پاشی ئەم طوافە          سەعی رەوایە و دوورە لەخلافە

هەرچەند مایەوە بەمیوانی بەیت          ببە بەمشکات بۆمصباحی رەبیت

چرای رەبیتکی صافو پرتەو دار          زەیتی حضور و حیا و ئعتبار

ساعاتی حضور لەو بارەگادا          هەیەتی بەسەرزینی دنیادا

بارانی انوار بەتاو دیتە خوار          دائەگری هەموو پاکو تاوان بار

بەآرام ئەرژی بەسەر دلانا          بەوێنەی شەونم بەسەرگولانا

ئەشۆرێتەوە خەتای خەتابار          بەوێنەی باران لەبۆتوزی دار

عالەم لەلولی بەرگو پۆشاکا          ئەسورێنەوە بەبەیتی پاکا

ئەگەرێن بەجۆش بەدەوری مالا          رەنگو داماوان لەسیاسالا

بەتاوی دەرون ئەپاڕێنەوە          بەچەندین زمان ئەلالێنەوە

کەعبەیش رەمزێکی خودای ئاناییە          کانی انوارو جێی تەجەلایە

لە عەرزدا تا بەرز کۆلەکەی نورە          دوسەری کەعبەو بیت المعمورە

کەعبە معمورە بە ئەهلی حضور          بیت المعوریش بەفریشتەی نور

وێنەی مەرکەزی گورەی عالەمە          دائیرەیش کەللەی بنی آدەمە

وینەی کارەبا دڵ ڕا ئەکێشی     ئەڵێی بە دەرمان بۆ هەموو ئێشی

ئادەم لەو شوێنیا قەت بێ بەشی نابێ     کێ بە سورمەی ڕەش چاوی ڕەش نابێ

باوەڕم وایە لاوێ ئەجوشێ     وەک دەریای ڕەحمەت سەرژدا ئەپوشی

جا مادام پایەی کەعبە وەهایە     عەرشە جیلوەگای عەفوی خوذایە

دڵ لەو مەقامە با ئاگادار بێ     بۆ فەیضی ڕەحمەت بە ئینتظار بێ

ئەگا تەجەلای فەیضی خودائی     لە ئاسمان دەرچێ بەبێ ئاگائی

ئەم دنیا وینەی کوگاڵی کایە     خێرێکی تیابێ دانەی صەفایە

فرصەتە ئەمساڵ بۆ ماوەی خەرمان     خەرمان هەڵ بگرن آمان صەد آمان

عومر باغێکە بە سوود و ثەمەر     ثەمەر بە مەوسم لێوە ئێتە دەر

مەوسم حەصادە آخ بۆ هوشیاری     بە زایە نەدا فرصەت بۆ کاری

فرصەت ڕا بگرن سعادەت ئەگرن     بۆ دین و دنیا بارە وەرئەگرن

بەشی دنیاکەت بەبێ آلوزی     لەوەیە بژیت لەگەڵ پیروزی

بەشی دینەکەت لەوەیە ستبەی     بە باری ڕەضای ذاتی حق بگەی

لە ئێمە سەعیە و تەوفیق لە خودا     بیرێژی فەیضی بە کورەی دڵدا

بە پایەی ئەوەی کابەی آوا کرد     صەرفی نظری لە ماسیوا کرد

ڕەهبەری عالەم ئەنوری آدەم     محمد (صلی الله علیه وسلم) لە بۆ ڕەهبەران خاتەم

## خولاصەی ئەو سێ شێوە بە بڵاوی

ئەگەر بە تمتع ئیحرام ببەستی واجبە لە میقاتا نیەتی عومرە بێنی بە تەنیا وە مەشغولی لبیک کردن بێ تا ئەگاتە نزیکی حەرەمی مەکە لەویا غوسل بکا جا داخلی مزگەوت ببێ وە لە پێش هەموشتێک حەوت جار طوافی کعبة اللە بکا بەو یاسا کە باسمان کرد لە پاشی طواف بڕوا دو رکات نوێژی سونەتی طواف بکا لە پشتی مقامی حەزرەتی ابراهیم وە علیە السلام ئەوسا بڕوا بۆ استلامی حجر الاسود جا بڕوا بۆ صفا و مەروە حەوت جار بەو مابەینا هاتوچۆ بکا جا خۆی ڕزگار بکا بە سەرتاشین یا مو هەڵپاچین وە ئەمەکەدا بمێنێتە وە تا کاتی حەج جا لەگەڵ خەڵکی مەکەدا ئیحرام ببەستی بە حەج وە آدابی حەج تەواو بکا وەکو باسی ئەکەین .

وە ئەگەر بە شێوەی قران ئیحرام ئەبەستی ئەوە لە میقاتا بە نیەتی حەج و عومرە پێکەوە ئیحرام ببەستی کاتی گەیشتە نزیکی حەرەم غوسل بکا وە کاتی داخلی ساحەی کعبە بو طوافی قدوم بکا بە یاسای پێشو وە بە ئیحرامەوە بمێنێتە وە هەتا حەجیش تەواو ئەکا وە خاوەنی تمتع وە قران هەردو فیدیە یان لە سەر واجب ئەبێ وەکو باسی ئەکەین ان شاء اللە تعالی

وە ئەگەر بە شێوەی افراد ئیحرام ئەبەستی لە میقاتا بە نیەتی حەج بە تەنیا ئیحرام ببەستی وە مەشغولی لبیک کردن بێ تا نزیکی حەرەم ئەبێتە وە لەویا غوسل بکا و بڕواتە ساحەی کەعبە وە طواف القدوم بەجێ بێنێ وە بە احرامەوە دەوام بکا هەتا حەجەکەی تەواو ئەکا بە ڕاوەستانی عەرەفات وە باقی آدابەوە وەکو بەیانی ئەکەین وە لە پاش حەج عومرەکەی بکا وەکو باسی دێت

باسی چونە دەرەوە بۆ عەرەفات وە باقی واجبات

لە پاش نیوەڕوی حەوتی ذی الحجە — ئیمام خوتبەئێ ئەدا خوش لە حجە
ئەلێ سبەینێ ئەڕوین بۆ مِنا — وەهایە و وایە فەرمانی خودا
جا سبەی ئیمام ئەڕوا لەگەلیان — بۆ خاکی مِنا بۆ هێزی دلیان
شەو لەوێ ئەبن کە سبەینێ هات — لەوێ دەرئەچن ڕو بە عەرەفات
ئەگەر شەو نەبوی لە عەرزی مِنا — فیدیەی تیا نیە لە پاسای (دینا)
گەیشتنە (نەمرە) هەمو دائیشن — پشوی آسایش بە دل ڕائەکیشن
لە پاش زەوال دا ئیمامی سلیم — لە ناو مزگەوتی خلیل ابراهیم
دو خوتبە ئەدا بۆ حجاج یە عام — نصیح و تبلیغ سەراسەر احکام
پاش خوتبەی یەکەم بانگ دەر بانگ (ئەدا) — لەگەل دوهەما بانگ ئەدا و ئەکا
ئیمام دو نوێژی عصر و نیوەڕو — بە جمع و بە قصر ئەکا لەسەر خو
بە مسافران ئەکا ئەهلی مکە — اتمام بو ئەوان فەرزی بێ شکە
جا ئەڕون لە بۆ عەرصەی عەرەفات — لەوێ ئەبن هەتا ڕوژ غروب ئەکات
حمد و تسبیح و تهلیل و دعا — لبیک ئەکەن بو رضای خودا
مشهورە وقوف لە جمعەی انور — حجت بو ئەکا بە حجی اکبر
خێری زورترە لە حەفتا جاران — حجەکانی تر بو طاعەتکاران
واجب حضورە لە عەرەفاتا ... هەرچی لا رابوری بەشەو لێستاتا

بەلی واجباکە نەزرنە سبیەر    لەبەر تواضع بوچونای اکبر

کاتی راوەستان لەعەرەفاتە    بەو شیوە شرعا لە واجباتە

لە پاشی زەوالی روژی عەرەفە    تا فەجری روژی جەژنی شرفە

لە پاشی غروبیش تازەردە ئەروا    سوننەتە حاجی بچینی لە دیا

ئەگەر پیشی غروب لەوی دەرچی    ئەبیش گەڕێتەوە تا روژ ئاوابی

فیدیەی پیویستە وقوف بەم تەرزە    لای زور سوننەتە لاکیش فەرزە

چونکی دانەیەک لەبو روژ وشەو    پیویستە لەویا لەی چاوەنی بریتەو

جا ئەگەر فەرزە فیدیەکەی فەرزە    ئەگەر سوننەتە ئەویش بەو تەرزە

ئەی ئینسانی هوشیار لەو شەویدا کاتا    بیتو بروانی بەعەرەفاتا

دیمەنی حەشرە دیتە بەرچاوی    دیتە کول بەحق دڵو هەناوی

مەوج ئەداتەوە ئەو ساراو دەشتە    هەرکەس بەجوری زوی لەبەهەشتە

بازی بە لبیک لبیک کاری    بەبازی بەدوعاو نزاو زگاری

بازی بەجوشی دەروونی بوریان    بازی خروشی دیدەی پڕ گریان

بازی کەس مەستی تجلی نوورە    کەزاتو ئەروا ئەلی مخمورە

بازی سەرسامە بێ دەنگو صدا    . بازی بانگ ئەکا ئەلی یا خودا

گەر راستت ئەوی دیمەنی وایە    لایقی جیلوەی نووری خودایە

## دابەزین بۆ موزدەلفە

پاش ڕۆژاوابون لەسەر عەرەفە — دائەبەزنە خوار بۆ موزدەلفە
مەغریب و عیشا بە جمع التأخیر — لەگەڵ قصرە دا بکە بێ تقصیر
قصر هەر تەنیا لە بۆ عیشا یە — بۆ مسافری دورە ما وایە
لە موزدەلفە لە پاش نیوە شەو — ئەزە وایە حاجی بکەوێتە ڕەو
لە پێش نیوە شەو گەر یەکێ دەرچێ — ئەگەر نەیەتەوە فیدیەی لێ ئەچێ
بە قەولی سوننەت بە قەولی فەرزە — ئەو مانەوەیە لەو خاکی عەزیزە
(عەقەبەی تێ)
حەوت بەردی پاک لەوێ هەڵ بگرێ — ڕەجمی شەیتانی پیسی پێ بکرێ
لە پاش نیوە شەو ئەوەی ضعیفە — دەرچێ بۆ مشعر لە موزدەلفە
ئەلام وانەن حەیز لەوێ بمێنێ — تا نوێژی صوبحی بەجێ ئەهێنێ
جا بە تاریکی دنیاوە بە عام — بڕۆن تا نوختەی مشعر الحرام
لەویا ڕا وەستن زۆر مرتبە — جا بڕۆن ئەبۆ جمرەی عقبە
لە پاش دەرچونی هەتاوی لێ گەڕێ — کوگای عقبە بدەنە بەرد
پاش ڕەجمی بکەن بە حەوت بەردی پاک — لەگەڵ تکبیری بۆ یەزدانی پاک
لەگەڵ هەر بەردی تکبیری خوا — بکەن لە باتی لبیک لەویا
ئەمجار ئەو کەسەی حەیوان سەرئەبڕێ — لە قصابخانەی منا دای بگرێ
هەرچەن جائزە بە شێوەی تحقیق — هەتا آخری ایام التشریق

ئەم جار سەرتاشین یا هەلپاچینە        ئەو بو پیاو ئەم ژن حەیلی شیرینە

ئەگەر بی مو بو هەر روا سوننەتە        مووسی پیا بینی خیر و رەحمەتە

لە پاش ئەمانە طوافی فەرزە        جا سەعی صفا و مروە بەو تەرزە

بە دو لە رەمی و لە حەلقو طواف        یەکەم تحللی ئەبی بی خلاف

زەوایە غەیری نکاحو جماع        مقدماتیش بەشیوەی اجماع

بوت حەلال ئەبی بەرگت لەبەرکەی        نینوکت بکەی موی لەشت لابەی

بە سی هەمینیشی دوەم تحلل        دیتەجی و ممنوع حەلالە بالکل

مەبەس ممنوعی بە هوی ئیحرام بی        نەک ممنوعاتی یاسای ئیسلام بی

ترتیبی رەمی و ذبحو سەرتاشین        لەگەل طوافا سوننەتە بو دین

یەکەمین رەمیە سەربرین دووەم        حلق یا تقصیر کردەوەی سیهەم

بەروو روابیشیان هەر روا رەوایە        بەلام ترتیبە احسانی تیایە

کاتی ئەوانە غەیری سەربرین        دی بە نیوەی شەو لە جەژنی شیرینا

ئەمینی کاتی رەمی عەقەبە        تا حونداوای جەژن لی قرەوقەبە

وەختی فضیلەی دەرچوونی هەتاو        تا رەوالی روژ بوت ئێتە بەرچاو

کاتی اختیار تا روژ آوایە        لە روژی جەژنا هەتا هەتایە

حەلقو تقصیرو طواف بەکەمال        دروستە بکرین تا آخر یەک سال

بەم شەرتە حاجی لە ئیحرامە دا    بمێنێتەوە لەو نیظامە دا

لە مەیشی دەستی نادا بە یاسای عادەت    کە وابێ ڕێگەی لقای سعادەت

هەروەها چاکە لە ڕۆژی جەژنا    ڕەمی و ذەبح و حەلق بکا لە منا

لە عەینی ڕۆژا بڕوا بۆ طواف    جا سەعی بەینی صفا و مەروەی ساف

بۆلی مکروهە تأخیریان بکەی    لە ڕۆژی جەژنا ئەوانە نەکەی

مەگەر بۆ معذور بە وێنەی محصر    یا بۆ حائض و نفسانی ڕوسور

لە بۆ ئەمانە ڕەوایە تأخیر    وەهایە شەرعی حەزرەتی بشیر

چون باسی حەجە باشە بیزانن    زانای خێرە هەتا ئەتوانن

(جمع عرفی مزدلفەیە خلاف زانا لەم باسانیە ص)

عمومی زەمینای وادی محسر    هەم مزدلفە حەرەمن یەکسەر

قزح تەپۆلکەی مشعر الحرام    لە مزدلفەش بیزانە تەمام

جمرەی عەقبە لە مینا نیە    لە لای کۆمەڵەی زانای دینیە

وادی محسر نە لە میناییە    نە مزدلفە زانا ئاگایە

بەلکو حەمەری ئاوی بارانە    هەرچەن حەرەمە باشی بزانە

جا پاش ئەوانە بڕۆ بۆ طواف    طوافی ڕوکنی حەجە بێ خلاف

جا سەعی مابەین بۆ صفا و مەروە    ئەگەر نەت کردبو لە پێشی ئەم دەورە

جا بڕۆرەوە زەمینا بێ صدا    نوێژی نیوەڕۆ بکە بۆ خودا

## باسی دەرچوون لە مەکە بۆ عەرەفات

پاش ئەوە لە طوافی قدوم وە لە سەعی بەینی صفا و مەروە بوونەوە سوننەتە
روژی هەشتەمی مانگی قوربان ئیمامی کۆمەڵ لە پاش نیوەڕۆی روژی یەکە خوتبە
بدا بۆ حاجیەکان وە باسای دەرچوون لە مەکە وچوون بۆ عەرەفەیان نیشان بدا
جا سبەینی روژی هەشتە پاش نوێژی روبکەن لە خاکی (منا) وە کاتێ گەیشتنە منا
دابەزن وە نوێژی نیوەڕۆ وعصر ومغرب وعشای تیدا بەجێ بینن وە شەو
سوننەتە لەوێ بمیننەوە وە مشغولی لبیک کردن وە ذکر ودعا بن وە نوێژی
صوبحیشی لەوێ بکەن ئەمانە هەموو سوننەتن وە لە واجباتی نین ئەگەر شەو
لە منا نەمانەوە ئازادن بەلام سوننەتەکانیان فەوتاوە وە ئەجریان ناقص
جا لە روژی نوی مانگدا کاتی هەتاو دەرهات لە شوێنی خویان دەرچن بۆ
عەرەفات وە لە رێگەدا لبیک لبیک وە ذکرودعا زۆر بکەن وە سوننەتە
لە رێگەی (ضب)ەوە کە کێویکە لە نزیکانا وە مزگەوتی (خیف) وا لە خوارییە
بڕۆن بۆ عەرەفات بو لەوەوە لەوسەرەوە لە رێگەی (مازمین)ەوە دابەزن
بۆ (مزدلفە) جا کاتێ گەیشتن بە (نمرە) دابەزن لەو شوێنا حەزرەت صلی الله علیه وسلم
تیایا دابەزیوە ئەوەی نزیکی بەردیکە لە بنی کێویک دا کە کەوتوە تە لای راستی
کەسێ بڕوا بۆ عەرەفات وە لە ژێری لەو کیوا ئەشکەوتی هەیە مشهورە حەزرەت صلی الله علیه وسلم
لەویا ماوەتەوە هەتا ری کەوتوە بو عەرەفات . جا لە نمرەدا دانیشن

تا پاش زەوال جا سوننەتە غوسل بکەن بۆ وقوفی عەرەفات وە حاجیەکە لەگەڵ
ئیمامدا بڕۆن بۆ مزگەوتی نەمرە کە مەشهورە بە مزگەوتی (ابراهیم) وە ئیمام لە پێش
نوێژا خطبەی بخوێنێ وە ئادابی ئەو ڕۆژەشە وەیان بۆ باس بکا کاتێ ئەو خطبەیە
تەواو کرد دابنیشێ بە قەدی سورەتی اخلاص جا هەستێ بۆ خطبەی دووەم وە
مؤذن دەست بکا بە بانگ تا ئەو بانگ ئەبێتە وە خطیبیش خطبەی دووەم
تەواو بکا وە دابەزێ نوێژی نیوەڕۆ وە عەصر بە جمع التقدیم (وە قصر) بکا پێیان بە
یەک بانگ وە دوو قامەت وە ئەگەر ئەهلی مەککەش اقتدایان کرد بە ئیمام
پاش سلام دانەوە لە نوێژە کورتەکەی خۆی بڵێ هەر کەس مسافر نیە هەستێ
نوێژەکەی تەواو بکا بۆخۆی وە پاش ئەم نوێژانە وڵاتیان ماتل نەبێ وە بڕۆن
بۆ عەرەفات وە ئەگەر ئەو ڕۆژە جمعە بو ئەوان نوێژی جمعە ناکەن چونکی
شرطی صحەتی جمعە نایەتە جێ : کاتێ داخلی عەرەفات بوون لە هەر شوێنی کا ڕاوەستن
دروستە بەلام جوانترە لەو شوێنە بێ کە حەزرەت صلی الله علیه وسلم تیایا ڕاوەستاوە
کە شوێنی چەند بەردێکی گەورەی ڕاخراون لە خوارێ (جبل الرحمة) وە .
وە سوننەتە بۆ پیاو ڕاوەستان وە بۆ ژنان دانیشتن وە لە عەرەفاتا سوننەتە
مەشغولی لبیک لبیک کردن وە قورئان خوێندن وە لا اله الا الله کردن وە
دوعای خێر بکا بۆ خۆی و دایک و باوکی و خزمانی و باقی موسلمانان وە صلوات بدا لە حەزرەت صلی الله علیه وسلم

بزانن واجباتی عەرەفات دووشتە یەکەم لەوێ ڕاوەستانە لەپاش زەوالی
ڕۆژی نۆهەمەوە بێ تا طلوعی فەجری ڕۆژی جەژن وە هەرکەسێ کاتێ لەوێدا
لەعەرەفاتا بێ کافیە وە حەجەکەی تەواوە ئەگەرنا حەجەکەی لەو سالا فەوتاوە
دووهەم ئەوەیە بەزووی ڕاوەستا و ئەهلی صحەتی عیبادەت بێ یانێ سەرخۆش
وە بێهۆش و دیوانە نەبێ :

وە سوننەتەکانی عەرەفات زۆرن یەکەم خۆشۆردن لە نەمرەدا دووهەم گوێ
خوتبەی ئیمام سێهەم جمع التقدیم بۆ نوێژی نیوەڕۆ و عەصر چوارەم پەلەکردن
بۆ داخل بوونی عەرەفات پاش نوێژەکان پێنجەم لەپاش ئەو نوێژانە بڕواتە
خاکی عەرەفات شەشەم سەعی بکا بوئەوە لەو شوێنی حەزرەتا ڕاوەستێ ئەگەر زەحمەت
نەبێ هەرچەندێ دەقیقەیێ حەوتەم بەپیادە لەوێ بمێنێ وە نەک بەسواری هەشتەم
ڕاوەستان بۆ پیاو وە دانیشتن بۆ ژنان نۆهەم ڕوو بە قیبلە بێ لە ڕاوەستان وە
ڕاوەستانا دەهەم ئەوەیە ڕۆژوو نەگرێ لەوێ ڕۆژا یازدەهەم ئاگای لە دڵی خۆی
بێ وە بیرهوەری ڕەحمەتی خودابێ دوازدەهەم زۆر دوعا و تەهلیلە وە قورئان
خوێندن بکا لە دوعا مأثورەکانە اللهم آتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة
وقنا عذاب النار سیازدەهەم بڕواتە بەرسیبەر هەتا بتوانێ چواردەهەم ڕۆژ
بداتە دەم شەو یانێ لەپێش خۆرئاوا دەرنەچێ هەتا ڕۆژی لێ ئاوا ئەبێ ئەگەر
لەپێش غروبا دەرچوو وە پاش غروب نەهاتەوە بۆ عەرەفات سوننەتە حەیوانێ سەربڕێ

چواردەهەم خێروصدقە کردنە لەو ڕۆژدا یانزەهەم خۆپاراستنە لە ڕەفتار و وکاری بێ سود وە بەتایبەتی جدال لەگەڵ ڕەفیقانا :

## باسی دەرچون لەعەرەفات

سونەتە بوسەرقافلەی حاجیان کاتی ڕوژئاوابو بەراستی لەعەرەفات دابەزێ لەگەل حاجیەکانا وە نوێژی مەغرب دوابخەن بەتەئخیری ئەوەکەلەگەل عشادا لەموزدلفەدا بەجمع التأخیر بیکەن وە خەلکە ئاگاداربکا لەم قەرەبالغیە بەستە وە بەرێگەی تەنگەبەرە (مأزمین) دابرون بوموزدەلیفە کە ئاخرحدی حەرەمە لەوجانبەوە وە سونەتە کەئیمام وەباقی خەلکە بەئارامی وەئەدەب دابەزنە خوارەوە وە بەرێگەدا زور لبیک لبیک بکەن وە ذکرودوعا بخوێنن . وە کاتی گەیشتن بەموزدەلفە نوێژی مغربوعشا بەجمع التأخیر وە بەقصر بکەن وەکولەپێشەوەدا باسمان کرد وە ئەگەر حاجیەکان ئەم نوێژانەیان بەغەیری جمع یا هەرکەسی بوخوی نوێژ بکا ئەوە دروستە بەلام بەخێری ئەم سونەتە ناگەن . وە سونەتە غوسل بکەن لەموزدەلیفەدا وە شەو لەوێ بمێننەوە وە ئەگەر مقداری لەپاش نیوەشەو لەویابن یاخود لەپێش نیوەشەوا دەرچن وە لەپاش نیوەشەوا بێنەوە بومزدلفە ئەم سونەتە جێبەجێ ئەبێ ئەگەر هەر نەچون بومزدلفە یاخود لەپاش نیوەشەو ئەبون لەوێدا ئەوە فیدیەیان لەسەرە وە ڕاستتر ئەوەیە ئەو مانەوەیە واجبە وە لەکاتی تەرکیا فیدیەکەیشی واجبە

وە سوننەتە شەو لە موزدەلیفە دا هەر کەسێ حەوت بەردی وەکو نۆکێ لە موزدەلیفە
هەڵ بگرێ بۆ ڕەجمی شەیتانی عەقەبە لە سبەینێ دا وە بەردی ڕەجمی هەرسێ کۆگاکان
لە ایام التشریقیا لە خاکی (منا) دا هەڵ بگرن وە بازێ ئەڵێن هەمویان کە
ئەکاتە حەفتا بەرد لە موزدەلیفە هەڵ بگرن :

وە سوننەتە پیر و لاواز و بێ هێز لە نیوە شەو بە دواوە دابەزن بۆ مشعر الحرام
وە جوان و خاوەن هێزەکان هەر لە جێگەی خۆیانا مەشغولی ذکر و طاعەت بن هەتا
بەیانی کاتی طلوعی فەجری دا نوێژی سبەینێ بکەن وە بڕۆن بۆ لای [illegible]
حاجیەکان وە کاتێ گەیشتن بە مشعر الحرام کە تەپۆڵکەیێکی بچوکە وە ناوی
(قوزەحە) ئەگەر ئاسان بوو سەرکەون بە سەریا ئەگەرنا لە نزیکیا ڕاوەستن
ڕوو بە قیبلە دوعا و حمد و تکبیر و تهلیلە و لبیک لبیک بکەن تا پێش هەتاو کەوتن
هەبوو دەرچن لە مشعر الحرام وە موزدەلیفە بەجێ بێڵن وە تێپەڕ بکەن لە (مِنا) بە ئارامی
وە لبیک لبیک بکەن تا ئەگەن بە (وادی محسّر) جا تووندتر ڕۆن بە ڕێگەدا
هەتا ئەو وادییە ئەبڕن وە ئەگەن بە (عەقەبە) کە کۆگا بەردەکەی تیایە
جا پاش ئەوە کە ڕۆژ بە قەدی ڕمێ بەرز ئەبێتەوە یەکێ حەوت بەردییەکە یەکە
وە بیدەن بەو کۆگایە ئیتر لبیک لبیک بگۆڕن بە الله اکبر وە لەگەڵ
هەر بەردێ لەو حەوت بەردانە کە فڕێی ئەدەن بڵێن الله اکبر ..

بزانن لەم رەمیا چەن باسێ هەیە یەکەم واجبە ئەوەی فڕێ ئەدرێ بەرد بێ خواه
بەردی عادەتی یا مەرمەڕ یا یاقوت لە نەوعی بەرد دووهەم واجبە بەردەکان
بەصورەت جار جار فڕێ بدرێن ئەگەر دوو بەرد بە جارێک فڕێ بدرێن ئەوە بە
یەک رەمی حسێبە سێهەم واجبە بە وەزعێ بێ کە لە عورفا بە فڕێدان لێ
ئەنا ئەگەر ئەو بەردانە دابنێ لە ناو کوگاکەدا ئەوە دروست نیە چوارەم
واجبە قصدی ئەو کوگا تایبەتی بکرێ ئەگەر بە بەردێ بۆ شوێنی تر فڕێ دا وە
کەوتە ئەو شوێنە دروست نیە پێنجەم واجبە ئەو بەردە بکەوێتە ناو ئەو
ئەو کوگایە ئیتر بمێنێتەوە لەویا یا خود دەرپەڕێ فڕێ ناکا ئەمانە واجباتن
وە چەن شتێکیش لێدا سونەتە یەکەم کاتێ حاجی گەیشتە مینا لە پێش هەموو کارێ
رەجمی ئەو جمرە بکا دووهەم سونەتە ئەو رەمیە لە پاش دەرچون وە بەرزبونەوەی
ڕۆژ بێ بە قەدەر رمحێ سێهەم سونەتە لە خوارەوە راوەستێ وە ها کە شاری مەکە
بکەوێتە لای چەپیەوە وە مینا بکەوێتە لای راستیەوە وە روی لە عەقەبە بێ
بۆ پیادە
چوارەم سونەتە ئەوە ئەو دەستی بەرز کاتەوە کە بن بالی دەرکەوێ بەلام بۆ ژنان
ئەمە سونەت نیە پێنجەم سونەتە لە کاتێ دەوەل بەردا ئیتر تەرکی لبیک بکا وە بڵێ
الله اکبر لە باتی لبیک چونکە لبیک شعاری ئیحرامە وە رەمی شعاری ئازادیە
لە ئیحرام شەشەم سونەتە بە سواری ئەو رەمیە بکا حەوتەم سونەتە ئەو بەردە بە قەدی

بەردی پە لە پێنکە بێ نە زیاتر بێ وە نە کەمتر بەلام مکروهە بەشێوەی پە لە پێنکە بێ
بەلکو سوننەتە بەشێوەی فڕێدانی عادەتی بێ . وە هەرکەسی خۆی نەی توانی
رەمی بکا لەبەر نەخۆشی وەکو نەخۆشی وە خۆ نەگرتن لە ناوخەلکدا واجبە
لەسەری نائبی بگرێ وە واجبە ئەو نائبە (ئەگەر حاجی بوبێ) لە پێشدا رەمی بۆ خۆی بکا جا پاشان
ئەوە رەمی بۆ کابرا بکا : وە ئەگەر حاجی نەبوبێ هەر بۆ کابرا رەمی ئەکا
جا کاتی لە رەمی رزگاربو بڕوا لە شوێنێک دا دابەزێ لە مینادا وە لە هەرشوێنێکدا
دابەزێ دروستە بەلام سوننەتە لەو شوێنانەی کە حەزرەت ﷺ تیایا دابەزیوە وە
مەنزلی حەزرەت لە بەینی کوگای یەکەم و کوگای ناوەراستە لە لای لەو مزگەوتاکەوا
لەو شوێنە دایە وە بازێ فەرمویەتی مەنزلی حەزرەت لە لای چەپی جێگەی نوێژی ئیمامە
لەو مزگەوتا : جا کاتی گەیشتە ئەو شوێنە حەیوانی خۆی فیدیە یە یا هەدیە سەری ببڕێ
وە سوننەتە ئینسان خۆی حەیوانی خۆی سەربیڕێ وە ئەگەر بۆی نەکرا وەکیل بگرێ وە خۆیشی
حاضر بێ بەلایەوە وە سوننەتە رووی ئەو حەیوانە بکاتە قیبلە وە ناوی خودا بێنا
وە صلاوات بدا لە حضرەت ﷺ بەم عبارەتە بسم الله والله اکبر وصلی الله
علی رسوله محمد وعلی آله وصحبه اللهم منک والیک فَتَقَبَّل منّي أو تقبّل
من فلانٍ صاحِبها وە کاتی سەربڕینی ئەم حەیوانانە ئەوەیە بەقەی نوێژی
جەژن وە دوو خطبەی میانە لە پاش طلوعی روژ لە روژی جەژنا رابوری وە
باشتر ئەوەیە لە پاش رەمی جمرەی عقبە وە لە پێش سەرتاشینی خوابێ :

بەلام کاتی دروستی بونە و حەیوان سەربرینە ئەمینێتە وە هەتا روژاوای آخرروژی ایام التشریق : وە لەشەوەکانیشا دروستە بەلام مکروهە :

جا کاتی لەسەربرینی حەیوان رزگاربو لە مجارە سەری بتاشێ یا مووەکانی هەڵپاچێ بەلام بو پیاو تاشینی خێری زورترە وە بوژن کورتەوەکردنێ وەلای کەمی ئەندازە بو تاشین یا هەڵپاچینی سێ موە وەلای زوری هەموو مووی سەرە وە فەرمودەی بەحضرتی ئیمامی شافعی رضی الله ئەوەیە کە ئەم سەرتاشین یا هەڵپاچینە رۆکنیکە لە ئەرکانی حەج یا عومرە وە بەبێ ئەوانە حەجکەری یا عومرەکەری تەواو نابێ وە فیدیە جبری ناکاتەوە : وەهەتا بنالەسەرئەم فەرمودە ئەگەر کابرا سەرتاشی دەست کەوت ئەوە باشە وە ئەگەر خوی سەری خوی بتاشێ یا هەڵی پاچێ دروستە وە عەیبی نیە وەکو لە عبارەتی ایضاح وە غیری ایضاح بە آشکرا دەرئەکەوێ ،

جا پاش سەرتاشین ئیتر کاتی گەرانەوەیە بو مەکەی مکرمە زادها الله شرفا بو طوافی کعبەی شریفە کە روکنە لە حەجا :

وە دەرکەوت ئەوکردەوانە کە مشروعن لە روژی جەژنا چوارن یەکەم رەمی جمرەی عقبە دووەم بسەربرینی حەیوانی هەدی سێیەم سەرتاشین یا هەڵپاچین چوارەم رولیشتنە بو مەکەی مکرمە بو طواف ئەمانە بەم ریزە کە وتمان سونەتە ئەگەر حاجی مخالفەی کرد وە بارێکی پێشی بارێ خست ئەوە دروستە بەلام فضیلەتی فەوت کارەی فەوتاوە :

بزانن وه حتى طوافى روكن دائى به هاتنى نيوه شه‌و له‌شه‌وى جه‌ژنا به‌لام وتيان
سونه‌ته له‌سه‌ر ئه‌و دريژه بى كه ئوسيان ئه‌بنا ، عليه له‌پاش سه‌رتاشين كاتى
تحللى يه‌كه‌م ئيته‌جى وه ئه‌توانى غه‌يرى جماع وه نكاح وه مقدماته‌كانى هه‌موو
به‌جى بينى وه به‌رگى خوى بپوشى وه به‌طوافى روكن تحللى دووه‌م ئيته‌جى وه هه‌موو ئه‌ودانه‌ى
بوحه‌لال ئه‌بى :

ج كاتى حاجى له‌سه‌رتاشين بووه‌وه ئه‌گه‌ريته‌وه بو مكه‌ى مكرمه وه طوافى روكن
جى به‌جى ئه‌كا به‌و دياسه‌ كه به‌يانمان كرد ج پاش طواف بروات بو سه‌عى
له‌به‌ينى صفا و مه‌روه دا ئه‌گه‌ر له‌پاش طوافى قدوم سه‌عى نه‌كردبو ئه‌گه‌رناته‌كرارى
سه‌عى مكروهه وه پاش ئه‌م ئه‌عماله بگه‌ريته‌وه بو ارمنا ، وه ئوشيرى نيوه‌رو
له‌منا دا بكا :

ئه‌گه‌ر يارو پاش تحللى يه‌كه‌م نه‌هاته‌وه بو طوافى روكن وه ريگه‌ى ولاتى خوى
گرته به‌ر به‌جا هيلوه به‌نه‌زانى وه يا له‌بيرى چوبوه وه كه له‌وطوافى روكنه فه‌رزه
له‌سه‌رى ئه‌وه ابن حجر له‌حاشيه‌ى ايضاحا ئه‌فه‌رمويت مادام كابرا طوافى قدومى كردبى
بوى حسيب ئه‌كرى له‌باتى طوافى روكن وه حه‌جه‌كه‌ى ته‌واوه وهيچى له‌سه‌ر نيه هه‌روه‌ها
ژنى كه طوافى قدومى كردبى وه له‌كاتى طوافى روكن را توشى حه‌يز هاتبى ئه‌ويش ئه‌گه‌ر بروات ده‌
بوولاتى خوى ئه‌وه ئه‌و طوافى قدومه‌ى بوحسيب ئه‌كرى له‌باتى طوافى روكن ، وه ئه‌گه‌ر طوافى قدومى
نه‌كردبى ئه‌وه پاش مسافه‌ى قصر له‌مكه‌وه ئه‌توانى حه‌يوانى سه‌ربيرى به‌نيه‌تى تحلل وبروات وه به‌لام
طوافى روكن به‌فه‌رزى له‌سه‌رى ئه‌مينيته‌وه وه هه‌ركاتى بوى رى كه‌وت له‌گه‌ل ئه‌وانه
ئه‌رون بو عومره بروات وه وه له‌ميقاتا ئيحرام ببه‌ستى بو ته‌واو كردنى حه‌جه‌كه‌ى
وه طوافى روكن به‌جى بينى :

گەڕانەوە بۆ مینا بۆ ڕەجمی کوگاکان :

طوافی سەعیت کە بەجێ هێنا     بگەڕێرەوە بۆ خاکی مینا

لە پاشی ڕەوالی ئەم ڕۆژی جەژنە     خوتبەی لێ حەرقی پیامی مەزنە

لەبۆ ئاوایی ڕەمی و جەمرات     بوشەو مانەوەی مینای پڕخێرات

هەتا حاجیان بە بەصیرەت بن     لەسەر ڕەفتاری عالی سیرەت بن

جا لە مینادا شەوان دانیشن     بۆ ڕۆژی دواترا ئەوسا ڕاکێشن

وردە بەردی ڕەجم هەماشەختوسی     لەویا هەڵبگرن لەسەرەبەسی

سبەی پاشی ڕەوال هەرسێ کوگاکان     هەریەکە حەوت بەردی لێدەن بە تەکان

یەکەم لە دیانە لای مزگەوتی خەیف     دووەم ناوەڕاست لەی سەرای شەریف

سێهەمیان کوگای عەقەبەی گەورە     ڕەجمیان بکەن بە وتەی زۆر تەورە

هەموو بەردەکان یەک لەدوای یەک     دایان بهاوێن لێیان دابشەک

بە جاری دوو بەرد یا خۆ بە دانان     نابێ یا نەدەن لە ناو کوگاکان

کاتێ ڕەمیت کرد شەو عەینەوە     هەر لە مینادا خۆت بنوێنەوە

ڕۆژی دووهەم و سێهەمیش هەروا     هەرسێ کوگاکان لێدە بۆ خوا

یەکێ عوزری بو وەکیلی بگرێ     با حاجی نەبێ تا تەفرە نەدرێ

بەڵام با وەکیل پاش ڕەمی خۆی     بیکا بۆ ئەصیل ئاگای بێ بۆخۆی

هەر ڕۆژێ سەرەمی بۆ خۆی تەواو کا     پاشان بێتەوە بۆ ئەوی بکا

دا) واتە کابرای وەکیل حاجی بێ یا حاجی نەبێ هەر دروستە بێ بە وەکیل :

ئەگەر خۆ ڕەمیی لەوانە نەکا — فەرزە لەو ڕەمیە تەدارک بکا

شەوی داهاتو یا ڕۆژی دووهەم — پێش ئەدای حاضر بیە خاتر جەم

هەروەها ڕەمی جمرەی عەقەبە — کە فەوتا قەزای وا مرتبە

قەزای کائەوە پێش ڕەمی تشریق — ئەمەیە یاسای ترەمیت بە تاقیق

قەزا ڕەوایە لەپێش زەوالا — بوئەدا فەرزە لەپاش زەوالا

ئیمام ٢

سەروک پاش زەوال لە ڕۆژی دووهەم — خوتبەئی بدا پترەعنا بوحجم

گەلی ئیرشادو نصیحەت بکا — باسی دەرچونە ڕۆژی دو بکا

ثلیت ڕەوایە کە ڕۆژی دووهەم — پاش ڕەمی دەرچن لە مینای حەرام

بەلام بەو شەرتە پێش کاتی غروب — لە مینا دەرچن بو مەکەی محبوب

مانەوەی شەوی سێهەم نامێنی — شەریعەت لێدا کەرەم ئەنوێنی

ئەگەر ڕۆژی دو دەشان تاغروب — مانەوەی شەویان واجبە مطلب

هەمیش واجبە ئەبێ ڕەمی ڕۆژی سێ — ئەوسا خوا حافظ لە مینا دەرچی

ئەمەیە مەعنای خوتبەکەی ئیمام — عەزم کردنە بو حەججاجی کرام

سوننەت لەبو ڕەمی گەلێکن کاکە — یەکەم بەرز لەلوتر ئەو ڕەمیە چاکە

دووهەم ڕەمیەکان متوالی بن — بو جوملەو بو فەرد باشە حالی بن

سێهەم بابرامی دو ڕۆژی ئەوەل — بەپیادە بێ توا ئوئەجری اکمل

بو ڕۆژی سێهەم قەی ناکا سواری — بابیا وەری بێ ڕەحمەتی باری

چوارەم ئوێژی زۆر لەمزگەوتێ خێف  بۆتاوان ئەبێ بە مایەی تخفیف

جا قەولی هەیە ئەی کەرەم لێ مەلال  لەبۆ جوازی رەمی پێشی زەوال

وەرسوەرەیکە  لەبۆ شافعی  جەزمی پیاناوە شێخی رافعی

ئەمەیە رەمی  ایامی تشریق  لەپێش رەوالا حەقە بە تاقیق

بەرلە رافعی ئەم قەولە  بەعەین  تائیدی فەرمو ایمامی حەرەمەین

اسنوی ئەلی حسب الوافقی  ئەمە مذهەبە لەبۆ شافعی

هەرچەن کە تحفە تضعیفی ئەکا  لەبەرچاوانا تخفیفی ئەکا

بەلام شیروانی ئەلی بە تصریح  با اصح نەبێ قەولێکە صحیح

ابن حجرشی بەهەوی  پیاوە  تائیدی ئەکا لەروی دنیاوە

هەمویشی ئەزانین پایەی واقعی  لەبۆ اسنوی و لەبۆ رافعی

پایەی امام الحرمین  بەرز  شێخی غەزالی ئیمامی ٣ جەرز

تقلیدیان هەمو رەوایە بۆ عام  چون اختیاری قەولە بۆ امام

ئێمرۆ بۆ وەزعی هاتوچوی جهان  سیارەی زۆرو طیارەی جوان

رومیلیون حاجی بازیاد یاکەم  لەبۆ ادای حج ئەرون بۆ حەرەم

پیرو لاوازو نەخۆشی بێ گیان  خصوصی پیرەژن یا ژنی جوان

بازێکیان ئەمرن بازێکیان بێهۆش  بازی ئەکەونە ناو فتنەی ناخۆش

دەی با ئەم قەولە عالمی زانا  اعلانی بکا لەروی جهانا

